چیرۆکی پێغەمبەران

# چیرۆکی حەزرەتی ئیبراهیم

## (سڵاوی خوای لێبێت)

4

نووسەر : کەمال سەید

وەرگێرانی : ئازاد عەبباس گلێجالی




وێنە : حەسەنێین و تەیبە عەبدوڵڵا

ناوی کتێب: چیرۆکی حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت)
ناوی نووسەر: کەمال سەید
وەرگێڕانی: ئازاد عەبباس گڵێجاڵی
وێنە: حەسەنێین و تەیبە عەبدوڵڵا
نۆبەتی چاپ: دووەم/2022
چاپ: ناوەندی ڕێنوێن
تیراژ: 1000 دانە
ژپنک (ISBN): 978-9922-626-65-9
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (1330)ـی ساڵی (2018)ـی پێ دراوە.





**ناوەندی ڕێنوێن**
 07701932749 - 07501269689
 hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com
 سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک - نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)



چیرۆکی پێغەمبەران

# چیرۆکی حەزرەتی ئیبراهیم
## (سڵاوی خوای لێبێت)

نووسەر : کەمال سەید
وەرگێڕانی: ئازاد عەبباس گلێجالی
وێنە: حەسەنێین و تەیبە عەبدوڵڵا

4

## پادشایەک هەبوو بە ناوی (نەمرود)

ئەم پاشایە فەرمانڕەوای ئور و بابل بوو.. ڕۆژێک کاهینەکان هاتن بۆ لای نەمرود و پێیان گوت: ئەمساڵ منداڵێک لە دایک دەبێت و ئەو منداڵە کۆتایی بە پادشایی تۆ دەهێنێ!..

نەمرد فەرمانی دەرکرد و وتی: هەر کوڕێک لەدایکبوو بیکوژن!..

ئەو ساڵە حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) لەدایکبوو!.. دایکی زۆر ترسا.. لە ترسا کۆرپەکەی هەڵگرت و بردیە ئەشکەوتێکی بچووکی دەرەوەی شار..

ئەو سەردەمە خەڵکی چەند بتێکتان دەپەرست بە ناوی (مەردۆخ ـ سین ـ عەشتار) لە گەڵ ئەوەشدا ئەستێرەشیان دەپەرست..

حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) ـ منداڵ بوو باوکی کۆچی دوایی کرد ـ بۆیە لە ماڵی مامی کە ناوی (ئازەر) بوو گەورە بوو.. بوو بە لاوێکی هۆشیار و دانا و ژیر.. خوای گەورە ژیریی و زانایی پێ بەخشی..



ئێوارەیەک ئەم لاوە ژیر و زانایە ڕۆیشت بۆ پەرستگا.. خەڵک هەموو کۆببوونەوە و خەریکی پەرستنی ئەستێرەی ناهید (زوهرە) بوون.. حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) لە گەڵ خەڵکەکەدا وەستا.. دوای تاوێک مانگ هەڵات و بە تیشکە جوانەکەی خۆی سەرزەوی ڕووناک کردەوە..

ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) ویستی ڕاستی بە خەڵکەکە پیشان بدات و تێیان بگەیەنێ کە مانگ و ئەستێرە خوا نین.. بۆیە ئاماژەی بۆ مانگ کرد و بە خەڵکەکەی وت: ئەمە خوایە!..

خەڵکەکە هەموان لێیان پرسی: چۆن ئەوە خوایە؟!..

ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی: ئاخر ئەمەیان گەورەترە!.. ڕووناکترە.. جوانترە..

دوای ئەوەی شەو بەسەرچوو، مانگ ئاوابوو و خۆر هەڵات، حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی: ﴿هـذا رَبِّي هـذا أَكْبَرُ﴾ الأنعام: ٧٨ واتە: ئەمەیان خوای منە، چونکە ئەمەیان گەورەترە!..

ڕۆژیش تەواو بوو.. خۆر ئاوا بوو.. حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی: خەڵکینە! من بەریم لە بەندایەتی کردن بۆ خۆر و مانگ!.. من بەریم لە بەندایەتی کردنی ئەستێرەکان!..

من ئەو خوایە دەپەرەستم کە خۆر و مانگ و ئەستێرەکانی دروست کردووە..

## یەکتاپەرەستی

قسەکانی ئیبراهیم(سلاوی خوای لێبێت)ی لاو بە ناو خەڵکدا بڵاو بوویەوە..

ڕۆژێک حەزرەتی ئیبراهیم(سلاوی خوای لێبێت) بتێکی جوانی دروست کرد.. مامە ئازەری حەزرەتی ئیبراهیم(سلاوی خوای لێبێت) زۆر دڵخۆش بوو.. چونکە بەو کارەی ئیبراهیم(سلاوی خوای لێبێت) لە ناو حکومەتا پلەو پایە و دەسەڵاتێکی پێدەدرا.. بەڵام حەزرەتی ئیبراهیم(سلاوی خوای لێبێت) بتەکەی شکاند و وردوخاشی کرد..

ئازەر قیراندی وتی: ئەوە بۆ ئەو خوایە دەشکێنیّ و وردی دەکەیت؟..





ئیبڕاهیم(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی: ﴿يا أَبَتِ لِمَ تَعْبُدُ ما لا يَسْمَعُ وَ لا يُبْصِرُ وَ لا يُغْنِي عَنْكَ شَيْئاً﴾ مریم: ٤٢ واتە: ئاپۆ! تۆ بۆ شتێکی وا دەپەرەستی نەدەبیستێ و نە دەبینێ و هیچ بەهرەیەک بە تۆ نادات..

دیسان پێی گوت: ﴿يا أَبَتِ لا تَعْبُدِ الشَّيْطانَ إِنَّ الشَّيْطانَ كانَ لِلرَّحْمنِ عَصِيّاً﴾ مریم: ٤٤ واتە: ئاپۆ! شەیتان پەرەست مەبە! شەیتان سەرپێچی لە فەرمانی خوا کرد..

ئازەر زۆر تووڕە بوو، بە تووڕەبوونێکی زۆرەوە وتی: ﴿أَراغِبٌ أَنْتَ عَنْ آلِهَتِي يا إِبْراهِيمُ لَئِنْ لَمْ تَنْتَهِ لَأَرْجُمَنَّكَ وَ اهْجُرْنِي مَلِيّاً﴾ مریم: ٤٦ واتە: ئاخۆ ئیبڕاهیم(سڵاوی خوای لێبێت)! تۆ بێزاری لەوانەی من دەیانپەرەستم؟ ئەگەر دەست لەمە هەڵنەگری بەردبارانت دەکەم و تا ماوەیەکی زۆریش لە لام بڕۆ و ـ لێرە مەمێنە ـ .

ئیبڕاهیم(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی: ﴿سَلامٌ عَلَيْكَ سَأَسْتَغْفِرُ لَكَ رَبِّي إِنَّهُ كانَ بِي حَفِيّاً﴾ مریم: ٤٧ واتە: سڵاوت لێبێ! داوا لە پەروەردگار دەکەم لێت ببورێ، ئەو لەگەڵ من زۆر بەسۆز و میهرەبانە.

ئیتر حەزرەتی ئیبڕاهیم(سڵاوی خوای لێبێت) ماڵی مام و خزم و کەسوکار و هەموو خەڵکەکەی بەجێهێشت و لەوان دوورکەوتەوە..

## بوومەلەرزە

وەرزی بەهار بوو.. هەموو ساڵێک لە وەرزی بەهاردا خەڵکی بابل هەموویان لە دەرەوەی شار ئاهەنگیان دەگێڕا.. خواردنی خۆشیان دەخوارد.. هەڵپەڕکێیان دەکرد.. گەپ و گاڵتە و یارییان دەکرد.. دواتر دەگەڕانەوە بۆ شار، تاکو دیاری و قوربانی خۆیان پێشکەش بە کاهینەکان بکەن.

خەڵکی بابل هەر هەموویان چووبوونە دەرەوی شار بۆ ئاهەنگ گێڕان.. بەڵام حەزرەتی ئیبڕاهیم(سڵاوی خوای لێبێت) بە تەنیا لە ناو شاردا مایەوە.. تەورێکی هەڵگرت و بەرەو پەرستگا کەوتەڕێ..

لە ناو پەرەستگادا تەماشایەکی بتە بێگیانەکانی کرد و بە تووڕەییەوە فەرمووی: ئەوە بۆ ناخۆن؟!.. هۆڵەکە دەنگی دەدایەوە و حەزرەتی ئیبڕاهیم(سڵاوی خوای لێبێت) دەنگی خۆی دەبیستەوە کە دەیگوت: ئەوە بۆ ناخۆن؟..

هاواری کرد و فەرمووی: ئەوە بۆ هیچ ناڵێن و قسە ناکەن؟..

دیسان هۆڵەکە دەنگی دایەوە: ئەوە بۆ هیچ ناڵێن و قسە ناکەن؟!..

حەزرەتی ئیبڕاهیم(سڵاوی خوای لێبێت) بە تەورەکە بەربووە بتەکان.. جگە لە بتە گەورەکە هەموو بتەکانی شکاند.. بتەکان یەک بە یەک لەبەر پێی حەزرەتی ئیبڕاهیم(سڵاوی خوای لێبێت)دا دەکەوتن.. دەتگوت بوومەلەرزە لێی داون..

بەڵێ ئەوە بوومەلەرزە بوو.. بوومەلەرزەی بیروباوەڕ.. بوومەلەرزەی بڕوابوون بە یەکتایی خوای گەورە!..

حەزرەتی ئیبڕاهیم(سڵاوی خوای لێبێت) تەورەکەی نایە سەر شانی بتە گەورەکە و پەرستگای بەجێهێشت..



## دادگایی

دوای تەواوبوونی ئاهەنگ و شایی، خەڵکی بابل هەموویان بەرەو شار گەڕانەوە و هەمووا دیاری و قوربانی خۆیان پێبوو.. کاتێ گەیشتنە شار ڕوویان کردە پەرستگا..

کاتێ چوونە نێو پەرستگا، دەبینن هەموو بتەکان شکاون.. جگە لە بتە گەورەکە نەبێ یەک بت بە ساغی نەماوەتەوە..

بەڵام بتە گەورەکە وەک خۆی بوو.. هیچی لێ نەهاتبوو.. تەورێکیشی لەسەر شان بوو.. ئیتر کەس ئاوەزی ئەوەی نەبوو پرسیار لە بتە گەورەکە بکات و بڵێ: ئەوە چی قەوماوە؟.. بۆچی ئێرە وای لێهاتووە؟..



یەکێک لە کاهینەکان بۆڕاندی، وتی: ئەوە کێ زاتی ئەوەی کردووە ئاوا لە بتەکان بکات و تێکیان بشکێنێت؟!..

یەکێکیان وەڵامی دایەوە و وتی: کوڕە ئەوە لاوێک هەیە ناوی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت)ـە، هەبێ و نەبێ کاری ئەوە!.. ئەو هەموو جارێک پێی دەگوتین: ئەم بتانە بە کەڵکی هیچ نایەن، نە زیانیان هەیە و نە قازانج!..

نەمرود هەستیکرد کە حکومەتەکەی خەریکە لەرزۆک دەبێ.. بۆیە فەرمانی گرتنی حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت)ی دەرکرد..

سەربازەکان ڕۆیشتن و حەرزەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت)یان هێنا بۆ دادگایی..

دادوەر وتی: ئێمە زانیومانە تۆ گاڵتەت بە بتەکان کردووە.. ئەوەش دەزانین تۆ بەشداری ئاهەنگەکانت نەکردووە!.. ئێستا پێمان بڵێ: تۆ ئەم کارەت بەسەر بتەکان هێناوە؟..

حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) زۆر بە هێمنی فەرمووی: ئەوە بتە گەورەکە وای لێکردوون، ئەوەتا خۆتان لێی بپرسن!..

دادوەر وتی: خۆ تۆ خۆت دەزانی بت توانای قسەکردنی نییە!.. بت کەی قسەی کردووە؟..

حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) بە دەنگێکی گاڵتە ئامێزەوە فەرمووی: دەی بە چ عەقڵێکەوە ئەو بتانە دەپەرەستن کە خۆتان دروستتان کردوون؟..

هەموو خەڵکەکە شەرمیان لە خۆیان کرد و سەریان داخست.. تەنانەت دادوەریش سەری داخست و وەڵامێکی بۆ وتن نەبوو!.. هەمووان لە دڵی خۆیاندا وتیان: ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) ڕاست دەڵێت!..

بەڵام گەورەی کاهینەکان دیسان بۆڕاندی و وتی: چۆن دەتانەوێ لە ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) ببورن، چۆن لە کەسێک دەبوورن کە ئاوای بەسەر بتە پیرۆزەکاندا هێناوە؟!..

کاهینەکان ترسان خەڵکەکە لێیان ڕاپەڕێ و دەسەڵاتیان بڕوخێنرێ.. بۆیە ویستیان سزای حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) بدەن.. نەمردویش کە لای کاهینەکان دانیشتبوو.. هەستایە سەرپێ و بە دەنگێکی گڕ و تووند قیڕاندی، وتی: ئەو کارەی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) کردوویەتی تاوانە!.. دەبێ سزا بدرێ!..

ئیتر هەموو خەڵکەکە لەبەر نەمرود هەستانە سەرپێی و ئەوانیش وتیان: دەبێ سزا بدرێ!..

یەکێک لە کاهینەکان قیڕاندی، وتی: دەبێ تۆڵەی خوداکان بکەینەوە!.. دەبێ ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) بە ئاگر بسوتێنین!..

خەڵکەکە هەموو ـ وەک مێگەل شوێن کاهینەکە کەوتن ـ وتیان: دەبێ سزا بدرێ.. دەبێ بە ئاگر بیسوتێنن!..

لە ناو ئەو هەموو خەڵکەدا تەنیا دوو کەس خەفەتیان دەخوارد، ئەوانیش خاتوو (سارا)ی خاڵۆزای حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) و حەزرەتی (لوط)(سڵاوی خوای لێبێت)ی برازای بوو..

## دەسەڵاتی پەروەردگار

خەڵکی هەموو ڕۆیشتن بۆ دار کۆکردنەوە.. حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) زیندانی کرا.. نەمرود ویستی گفتوگۆ لە گەڵ ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت)دا بکات و بیبەزێنێ.. بۆیە بە حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت)ی وت:

- ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت)! پێم بڵێ: ئەو خوایە کێیە کە تۆ دەیپەرستی؟..

حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) زۆر بوێرانە فەرمووی:

- من ئەو خوایە دەپەرستم کە مردوو زیندوو دەکاتەوە و زیندوو دەمرێنێ..

نەمرود گاڵتەی بە وەڵامەکەی حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) هات و لە دڵی خۆیدا وتی: ئێستا دەیبەزێنم!.. پاشان بە دەنگی بەرز وتی:

- دەی ئەوە چیە؟ منیش دەتوانم خەڵک بمرێنم و زیندوویان بکەمەوە!..

نەمرود پلتۆکێکی تەقاند و فەرمانیکرد، وتی: دوو زیندانیم بۆ بهێنن!.. دوایی بە میرغەزەبی وت: یەکێکیان سەر ببڕە و ئەوی تریان ئازاد بکە!..

میرغەزەب یەکێک لە زیندانییەکانی سەربڕی و ئەوی تریانی لە کۆت و زنجیر دەرهێنا و ئازادی کرد.. نەمرود ڕووی کردە حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت)و پێی گوت:

- ئەها بینیت منیش دەتوانم خەڵک بمرێنم و زیندوویان بکەمەوە؟!..

ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت)ی لاو فەرمووی:

+ ئەو خوایەی من دەیپەرەستم، خۆر لە خۆرهەڵاتەوە هەڵدێنێ، تۆ دەتوانی بە پێچەوانەی ئەو، خۆر لە خۆرئاواوە هەڵبێنی؟..

نەمرود سەرشۆڕی بۆ مایەوە و نەیتوانی هیچ بڵێت!.

## ئاگری مەزن

ڕۆژی سزادان هات.. سەربازەکان ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت)یان لە زیندان هێنایە دەرەوە و بردیان بۆ دەرەوەی شار.. خەڵکی هەموویان چوونە دەرەوەی شار.. لەو دەرودەشتە ئاگرێکی زۆر گەورەیان کردەوە.. بڵێسە و کڵپەی ئاگرەکە دەچوو بە ئاسماندا..

هەموو ئەو خەڵکە لە ترسی گڕ و تینی ئاگرە گەورەکە ڕووی خۆیان وەردەگێڕا، تەنیا ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت)ی لاو و ئازا و بەجەرگ نەبێ، ئەو وەکو پۆڵا لە شوێنی خۆیدا وەستا و نەترسا..

کاهینەکان وایان گومان برد کە ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) دەترسێ و خێرا داوای لێبووردنیان لێ دەکات.. بەڵام ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) بڕوای بە خوای گەورە پتەو بوو.. هیچ شتێک ئەوی نەدەترساند.. تیشکی بیروباوەڕ و خواپەرەستی بە ناو چاوانییەوە دەدرەوشایەوە..



## بڕۆن مەنجەنیق بێنن و ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) بخەنە ناویەوە!

ئا لەو کاتەدا جوبرەئیل فریشتەی خوای گەورە هات بۆ لای ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت).. پێی وت: چیت پێویستە با بۆت جێبەجێ بکەم؟..

ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی: هیچم لە تۆ ناوێ!..

بە ئامێری مەنجەنیق حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت)یان فڕێ دایە نێو ئاگرە مەزنەکەوە..

خوای گەورە فرمانی بە ئاگر کرد و فەرمووی: ﴿قُلْنا يا نارُ كُونِي بَرْداً وَ سَلاماً عَلى إِبْراهِيمَ﴾ الأنبياء: ٦٩

واتە: گوتمان: ئاگر! سارد و بێ زیان بە بۆ ئیبراهیم.

بڵیسەی ئاگر دەچووە تەشقی ئاسمان، بەڵام توانای سوتاندنی نەمابوو..

ئاگرەکە حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت)ی نەسووتاند.. بەڵکو تەنیا ئەو حەبل وگوریسانەی سوتاند کە ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت)ی پێ بەسترابوویەوە.. ئەو شوێنەی حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت)ی تیابوو هەمووی بوو بە گوڵستان و باخچەیەکی سەوز و خۆش.. دەورووبەری باخچەکەش ئاگر بووا!..

هەمووان چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد ئاگرەکە دابمرکێتەوە و بکوژێتەوە و ئاهەنگی شادی و سەرکەوتن بگێڕن..

ئاگرە گەورەکە کەمە کەمە کوژایەوە.. نەمرود و کاهینەکان هەمووان پێکەوە ڕۆیشتن بۆ ئەوەی تەرمی سووتاوی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) ببینن.. کەچی بەچاوی خۆیان موعجیزە و پەرجوویەکی زۆر گەورەیان بینی.. بۆیان دەرکەوت خوای ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) خوایەکی زۆر بەهێز و دەسەڵاتە..

حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) نەسووتا.. بە ساغ و سەلامەتی هاتە دەرەوە..



## کۆچکردن

ماوەی چەندساڵێک ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) لە نێو گەلەکەی خۆیدا مایەوە و هەمووانی بۆ یەکتاپەرەستی بانگ دەکرد..

لەو ماوەیەدا حەرزەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) لە گەڵ خاتوو سارای خاڵۆزای خۆیدا هاوسەرگیری کرد.. خاتوو سارا کچێکی زۆر ژیر و بڕوادار بوو.. زەوی و زارێکی زۆر و بڕێکی زۆریش ئاژەڵی هەبوو.. هەرهەموو ئەوانەی پێشکەشی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت)ی هاوسەری کرد..

حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) مرۆڤێکی زۆر دڵاوا و سەخی و ماڵدار و میوان دۆست بوو.. بۆیە خوای گەورە پیت و فەڕ و بەرەکەتی خستە نێو زەوی و زار و ئاژەڵەکانییەوە..

کاهینەکان هەموویان ڕقێکی زۆریان لە حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) بوو.. نەمرودیش ترسی ئەوەی هەبوو دەسەڵاتەکەی بڕوخێ.. بۆیە نەمرود فەرمانی دەرکردنی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) و داگیرکردنی سەروەت و سامان و مەڕوماڵات و زەوی زاری حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت)ی، دەرکرد..



حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) بە دادوەری گوت: دەی ئەگەر سەروەت و سامان و زەوی و زارم داگیر دەکەن، ئەو تەمەنەم بۆ بگێڕنەوە کە لەم وڵاتەدا سەرفم کرد!..

دادوەر بڕیاری دا هەموو سەروەت و سامانی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) بۆ نەمرود بێ، بە مەرجێ نەمرود تەمەنی ڕۆیشتووی حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) بگێڕێتەوە!..

بۆیە نەمرود لە بڕیارەکەی خۆی پەشیمان بوویەوە و سەروەت و سامانەکەی بۆ حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) گەڕاندەوە و لە وڵات دەری کرد..

حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) کۆچی کرد.. کاتێ خەریک بوو لە شار دەردەچوو فەرمووی: وا من ڕوودەکەمە پەروەرێنم!..

حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) کۆچی کرد بۆ شوێنێکی تر بۆ ئەوەی بتوانێ بە ئازادی خەڵک بانگ بکات بۆ یەکتاپەرەستی و وازهێنان لە دەسەڵاتی ستەمکار و بتپەرەستی..

## لە سەرزەوی فەلەستیندا

حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) لەگەڵ خاتوو سارای خێزانیدا کۆچیان کرد.. حەزرەتی (لوط)(سڵاوی خوای لێبێت)یش کە ئەوکاتە هێشتا پێغەمبەر نەبوو لەگەڵیاندا ڕۆیشت..

حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) بەلای وڵاتی میسردا تێپەڕی.. پادشای ئەوێ ویستی سارا خاتوونی خێزانی حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) داگیر بکات و بیبا بۆ خۆی، بەڵام خوای گەورە دەست و قاچی گۆج کرد و لە کار کەوتن..

پادشا بۆی دەرکەوت کە ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) خوایەکی زۆر مەزن و بەدەسەڵاتی هەیە، بۆیە لە بڕیارەکەی پەشیمان بوویەوە و کەنیزەکێکی جوان و ژیریشی بە دیاری دا بە خاتوو سارا و ڕێگەی پێدان لەوێ دەربچن و بڕۆن..

حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) گەیشتە وڵاتی فەلەستین و ئەو شوێنەی کە ئێستا پێی دەڵێن (شاری خەلیل)..

بەڵام حەزرەتی (لوط)(سڵاوی خوای لێبێت) بەرەو وڵاتی ئەردەنی ئێستا ڕۆیشت بۆ ئەوەی ئەویش لەوێ خەڵکی بانگ بکات بۆ سەر ئایینی حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) و وازهێنان لە بتپەرەستی..



## سەرزەوی حیجاز

خاتوو سارا منداڵی نەدەبوو.. بۆیە بیری لەوە کردەوە کە هاجەری کەنیزەکی خۆی لە مێردەکەی مارە بکات، بەڵکو خوای گەورە منداڵیان پێ ببەخشێت..

حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) خاتوو هاجەری مارە کرد.. خوای گەورە کوڕێکی پێدان و ناویان لێنا ئیسماعیل.. خوای گەورە فەرمانی بە ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) کرد کە خاتوو هاجەر و ئیسماعیلی کوڕی ببات بۆ وڵاتی حیجاز (سعودیەی ئێستا) و لەوێ نیشتەجێیان بکات..

حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمانی خوای گەورەی جێبەجێ کرد.. ماوەیەکی زۆر ڕێیان کرد.. دەشت و سارای کاکی بە کاکییان بڕی.. هەتا گەیشتنە نێو چیا و دۆڵێکی وشک و بێ ئاو.. ئەو فریشتەیەی کە ڕێنوێنی حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت)ی دەکرد فەرمووی: ئێرە ئەو شوێنەیە کە خوای گەورە دەیەوێ هاجەر و ئیسماعیلی تێیدا نیشتەجێ ببن.. ئەوان لێرە دابنێ و خۆت بگەڕێوە..

ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) ماڵئاوایی لە خێزانەکەی کرد.. خاتوو هاجەر وتی: ئا لێرە و لەم شوێنە وشک و بێ ئاو و ترسناکە ئێمە بەجێدێڵیت؟..

ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی: ئەوە فەرمانی خوایە!..

خاتوو هاجەر وتی: دەی مادەم فەرمانی خوایە، خوا خۆی چاودێری ئێمە دەکات و لەبیرمان ناکات..

ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) ڕۆیشت.. دوای ماوەیەک ئیسماعیل لە تینوان دەستیکرد بە گریان.. هاجەر هەستا و هەتا تەپۆڵکەی (صەفا) ڕۆیشت بۆ ئەوەی بزانێ هەندێ ئاوی دەست ناکەوێ؟!..

دوایی بەرەو لای تەپۆڵکەی (مەروە) گەڕایەوە.. حەوت جار بەو شێوەیە گەڕا..

کاتێ گەڕایەوە بۆ لای ئیسماعیل، دەبینێ ئیسماعیل پێدەکەنێ و لە لای قاچەکانیەوە ئاو هەڵقوڵیوە و بووە بە کانی..



## ئیسحاق

پیریی ڕووی لە حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) کرد.. خاتوو ساراش بە هەمان شێوەی حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) پیر بوو.. ئەو دوو بەڕێزە بوون بە پیرەپیاو و پیرەژن..

ڕۆژێک هەندێ میوان هاتن بۆ ماڵی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) و زۆر بەڕێزەوە سڵاویان کرد..

ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) بە پەلە گوێرەکەیەکی بۆ سەربڕین و لەگەڵ خاتوو سارادا گوێرەکەیان برژاند و نان و خوانێکی زۆر پاک و خۆشیان بۆ میوانەکان ئامادە کرد..

کاتی نانخواردن ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) هەستیکرد میوانەکان دەست بۆ خواردنەکە نابەن، بۆیە ترسێکی لێ نیشت..

میوانەکان وتیان: ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) مەترسە!.. ئێمە مرۆڤ نین، ئێمە فریشتەی خوای گەورەین، خوای گەورە ئێمەی ناردووە تا بچین سزای شاری (سەدوم) بدەین، خەڵکی ئەو شارەی کە (لوط)(سڵاوی خوای لێبێت) پێغەمبەریانە..

خەڵکی شاری (سەدوم) بڕوایان بە پێغەمبەر (لوط)(سڵاوی خوای لێبێت) نەهێنابوو.. لە گەڵ ئەوەشدا گەلێکی زۆر پیس و چەپەڵ بوون.. هەمیشە خەریکی چەتەیی و ڕێگری بوون.. حەزرەتی (لوط)(سڵاوی خوای لێبێت) ماوەیەکی زۆر ئەو خەڵکەی بۆ یەکتاپەرەستی و دەست هەڵگرتن لە خراپەکاری بانگ کرد.. بەڵام تەنیا کچەکانی خۆی بڕوایان پێ هێنا و بوونە موسوڵمان.. تەنانەت ژنەکەیشی لایەنگری ئەو گەلە ستەمکارە کافرە بوو.. بۆیە خوای گەورە ئەو فریشتانەی ناردبوو تا سزای ئەو گەلە ستەمکارە بدەن.. کاتێ فریشتەکان دەیانویست بڕۆن بۆ شاری (سەدوم) بەلای شار و وڵاتەکەی حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت)دا تێپەڕین و لە ماڵی ئەوان لایاندابوو..

ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) ترسا (لوط)(سڵاوی خوای لێبێت)یش لە سەدوم بەر سزای خوا بکەوێ و شتێکی لێبێت، بۆیە فەرمووی: دەی خۆ (لوط)(سڵاوی خوای لێبێت)یش لە سەدومە!..

فریشتەکان وتیان: ئێمە خۆمان هەموو شتێ دەزانین..

حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) زۆری پێ خۆشبوو ئەو خەڵکە هەرهەموویان بێنە سەر ڕێگای ڕاستەقینە و بڕوا بە خوای گەورە و تاقانە بێنن، بۆیە زۆر هەوڵیدا کە فریشتەکان سزای گەلی (سەدوم) نەدەن، بەڵکو پەشیمان ببنەوە و بێنەوە سەر ڕێگای ڕاستەقینە و خواپەرەستی.. بەڵام فریشتەکان وتیان: تازە بڕیاری خوای گەورە دەرچووە و کار لە کار ترازاوە!..

خاتوو ساراش وەستابوو گوێی لە گفتوگۆی نێوان مێردەکەی و فریشتەکانی خوای گەورە دەگرت.. لەو کاتەدا فریشتەکان مزگێنی لەدایکبوونی منداڵێکیان بە ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) و خاتوو سارا دا.. خاتوو سارا سەری سوڕما وتی: هەیڕۆ! تازە من بەم پیرییە چۆن منداڵم دەبێت؟!..

فریشتەکان وتیان: بۆ تۆ سەرت لە کاری خوا سوڕ دەمێنێت؟!..

بەو جۆرە خوای گەورە ئیسحاقی بە ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) و سارا بەخشی..

## کەعبە

حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) بەرەو حیجاز (سعودیە) کەوتەڕێ.. ئەو کاتە ئیسماعیل گەورە ببوو.. لاوێکی زۆر جوان و بەهێز و ژیر بوو.. خوای گەورە فەرمانی بە حەرزەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) داکە دیواری (کەعبە) هەڵچنن..

دوای ئەوەی خوای گەورە ئاوی زەمزەمی بۆ خاتوو هاجەرە و ئیسماعیل هەڵقوڵاند، ئیتر ئەو شوێنە ئاوەدان بوویەوە و هۆزی (جورهوم) نیشتەجێی شاری مەککە بوون.. مەککە بوو بە شارۆچکەیەکی ئاوەدان..

حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) لە گەڵ ئیسماعیلی کوڕیدا پێکەوە دیواری کەعبەیان هەڵچنی.. ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) بە دەستی خۆی (بەردە ڕەشەکە)ی لە ناو دیواری کەعبەدا دانا.. ئەو بەردە ڕەشە کاتی خۆی فریشتەکان لە ئاسمانەوە هێنابوویان بۆ سەر زەوی..

دوای ئەوەی کار کردن تەواوبوو حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) و ئیسماعیل لە خوای گەورە پاڕانەوە و وتیان: ﴿رَبَّنا تَقَبَّلْ مِنّا إِنَّكَ أَنْتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ البقرة: ١٢٧ واتە: خوایە! لێمان قبووڵ بکەی، تۆ هەر بۆ خۆت زۆر بیسەر و فرە زانای.

## تاقیکردنەوەیەکی گران

دوای ئەوەی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) و ئیسماعیل کەعبەیان دروستکرد و مەراسیمی حەجیان بەجێهێنا، حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) لە خەویدا کوڕەکەی خۆی سەردەبڕی و دەیکرد بە قوربانی.. حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) دەیزانی کە ئەو خەوە خەوێکی پووچ نییە، بەڵکو فەرمانی خوای گەورەیە.. بۆیە بە ئیسماعیلی کوڕی وت:

﴿يا بُنَيَّ إِنِّي أَرى فِي الْمَنامِ أَنِّي أَذْبَحُكَ فَانْظُرْ ما ذا تَرى﴾ الصافات: ١٠٢ واتە: ئەی کوڕی خۆم!.. من لە خەونمدا وام دیوە تۆ سەر دەبڕم! خۆت چۆنی لێک دەدەیەوە؟..





ئیسماعیل کوڕێکی زۆر چاک بوو، زۆر ڕێزی لە باوکی دەگرت، بڕوای بە ئایینەکەی باوکی هەبوو، بۆیە لە وەڵامدا وتی: ﴿يا أَبَتِ افْعَلْ ما تُؤْمَرُ سَتَجِدُنِي إِنْ شاءَ اللَّهُ مِنَ الصَّابِرِينَ﴾ الصافات: ١٠٢ واتە: بابە! هەرشتێ پێت سپێردراوە بەجێی بێنە! خوا حەز بکات بەم زووانە تێدەگەی کە منیش لە خۆڕاگرانم!...

ئەوە گرانترین تاقیکردنەوە بووە لە ژیانی مرۆڤایەتیدا.. ئیسماعیل بە باوکی وت: باوکە! توند بمبەستەوە و زوو و بەپەلە سەرم ببڕە..

حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) نێوچەوانی کوڕەکەی ماچ کرد و ماڵئاوایی لێکرد..

کاتێ وەختی سەربرین نزیک بویەوە ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) گوێی لە دەنگێکی ئاسمانی بو دەیگوت: ﴿يا إِبْراهِيمُ * قَدْ صَدَّقْتَ الرُّؤْيا﴾ الصافات: ١٠٤ـ١٠٥ واتە: ئەی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) ئەوا خەونەکەت وەدی هێنا... دوایی خوای گەورە فەرمانی بە حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) کرد کە ئەو بەرانە سەر ببڕی و بیکات بە قوربانی کە خوای گەورە بۆی نارد!..

کاتی حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) لای کردەوە دەبینێ بەرانێکی زۆر جوان لە تەپۆلکەکەوە دێتەخوارەوە، ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) بەرانەکەی سەربڕی و کردی بە قوربانی و بەوجۆرە مەناسیکی حەج هەمووی جێبەجێ بوو..

دوایی حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) بەرەو فەلەستین گەڕایەوە..

خوای گەورە ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت)ی کرد بە پێشەوا و سەرکردەی خەڵکی.. حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) کەسێکی زۆر باوەڕدار و پاک بوو.. زۆر گوێڕایەڵی فەرمانی خوا بوو.. بۆیە خوای گەورە کردی بە خۆشەویسی خۆی.. خوای گەورە زۆری خۆش دەویست.. هەر لەبەر ئەوە بە (ابراهیم الخلیل) ناسرا، واتە (ئیبراهیمی خۆشەویست)..

کاتێ ژیانی دونیا بەرەو کۆتایی هات و مردن نزیک بوویەوە، حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) ئامۆژگاری ماڵ و منداڵ و کوڕەکانی کرد و وەسیەتی بۆ کردن، فەرمووی: خەڵکی بانگ بکەن بۆ ئایینی یەکتاپەرەستی..

دوایی حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت) چاوەکانی لێک ناو بۆ هەتا هەتایە ماڵئاوایی کرد و ئێستا گۆڕی پیرۆزی لە شاری (الخلیل)ـە لە وڵاتی (فەلەستین)..

خوایە! سەڵاوات و سۆز و میهرەبانی خۆت بڕیژە بەسەر پێغەمبەرمان موحەممەد(دروودی خوای لێبێت)، وەک چۆن ڕژاندووتە بەسەر ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت)دا.. بەڕاستی تۆ سوپاسکراو و بەڕێز و گەورەیت.

# چیرۆکی پێغەمبەران

4

قورئانی پیرۆز، ئەو کتێبەی کە خوای گەورە ناردوویەتی بۆ پێغەمبەری ئیسلام(صلى الله عليه وسلم)، گرنگترین و ڕاستترین سەرچاوەی ژیان و بەسەرهاتی پێغەمبەرانە.. چونکە قورئان لە لایەن خوای گەورە و میهرەبانەوە دابەزیوە بۆ سەر پێغەمبەری ئیسلام(صلى الله عليه وسلم)..

بۆیە دەبێ ئێمەش قورئان بخوێنینەوە و لێی ڕامێنین و سوود لەو چیرۆکانە وەربگرین، بۆ ئەوەی ئیلهامی لێ وەربگرین و ڕێگای پرشنگداری پێ بدۆزینەوە..

ئەو ڕێگایەی کە بەرەو ئاشتی و ئەوین و خۆشەویستیمان دەبات..
بەرەو ئەو بیروباوەڕەمان دەبات کە هەموو پێغەمبەرانی بۆ نێردراوە..
ئەم کۆمەڵە چیرۆکە لە قورئانی پیرۆز و تەفسیرە بەنێوبانگەکانی قورئان وەرگیراون.. بۆ ئەوەی گرنگی بە بیروباوەڕی منداڵانمان بدەین..






ناوەندی ڕێنوێن


07701932749 - 07501269689


hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com


سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک - نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)



9 789922 626659